# Between Two Worlds

# لە نێوان دوو جیهاندا



ئنگلیزی - کوردی



وەرگێڕانی:
دکتۆر ماکوک محمد قەرەداخی

پڕۆژەی خۆڕاهێنان لەسەر زمانی ئنگلیزی

ئاستی یەکەم :
دەسپێکەران

# Between Two Worlds

# لە نێوان دوو جیهاندا


**Stephen Rabley**

**وەرگێڕانی :**

**د.ماکۆك محمد قەرەداخی**

**dr.makok@hotmail.com**



**چاپی یەکەم**
**2005**

ژمارەی سپاردن ( 736 )ی ساڵی 2005



Joanna jimbuku is a nurse. She lives and works in north Australia. Her boss is Bob Mills – a Flying Doctor. He and Joanna go everywhere in *The Bluebird*, Bob's plane.

جۆنا جیمبوکیو پەرستارێکە، لە باکوری ئوسترالیا دەژی و کاردەکات. بەڕێوەبەرەکەی بۆب میلسە، کە پزیشکێکی گەڕۆکە، ئەو و جۆنا بە فڕۆکەکەی بۆب بۆ هەموو شوێنێك لە (بلوو بێرد) دەچن.

One morning in August, Joanna answers the phone. ***"Hello,"*** she says. ***"Doctor Mills' office."*** Then ... ***"A baby? Yes, I see. And you're in Woomara. Ok – we can be there in half an hour."***

بەیانییەکی مانگی ئاب، جۆنا وەڵامی تێلەفون دەداتەوە، دەڵێ :"هەلەو، نوسینگەی دکتۆر میلسە" پاشان ... "منداڵێك؟ بەڵێ دەزانم، وە تۆ لە (هوومارا)یت. باشە، ئێمە دەتوانین لەماوەی نیو کاتژمێردا لەوێ بین."



Five minutes later, Joanna and Bob are in *The Bluebird*. ***"How old is this baby?"*** asks Bob. ***"Eighteen months,"*** says Joanna. After a moment Bob looks at her. ***"Woomara is near your home town, isn't it?"***

پێنج خولەك دواتر، جۆنا و بۆب لە بلوو بێردن. بۆب دەپرسێت :"ئەم منداڵە تەمەنی چەندە؟" جۆنا دەڵێ :"هەژدە مانگ." پاش کەمێك بۆب تەماشای دەکات :"هوومارا نزیکی شارۆچکەکەی ئێوەیە، وانییە؟"

***"Yes, that's right."*** Joanna smiles. ***"It's a very small place."*** She looks out of the window. ***"There it is,"*** she says. ***"Can you see? Between those trees and the river."***

جۆنا زەردەخەنەیەك دەکات :"بەڵێ، ڕاستە وایە. جێگایەکی زۆر بچوکە." تەماشای دەرەوەی جامەکە دەکات، دەڵێ :"لەوێیە، دەتوانیت بیبینیت؟ لەنێوان ئەو دارانە و ڕووبارەکەدا."



Down on the ground, eight or nine are waiting for the Flying Doctor. They take him and Joanna to a small house. The baby's mother – Jane – is inside it.

لەخوارەوە لەسەر زەوی، هەشت نۆیەك چاوەڕوانی پزیشکە گەڕۆکەکە دەکەن. ئەو و جۆنا دەبەن بۆ خانویەکی بچوك. دایکی منداڵەکە (جەین) لە ژوورەوەیە.

Bob looks at the little girl for twenty minutes. Then he says, ***"I'm sorry, but Mary is very, very ill. It's her heart. She must go to a hospital in Sydney."***
***"Sydney!"*** says Jane.

بۆب بۆ بیست خولەك تەماشای کچە بچوکەکە دەکات (دەیپشکنێت). پاشان دەڵێ :"بەداخەوەم، ماری زۆر زۆر نەخۆشە، دڵیەتی. پێویستە بڕوات بۆ نەخۆشخانە لە سیدنی." جەین دەڵێ :"سیدنی!"



***"Yes,"*** Bob puts his hand on the woman's arm. ***"But it's OK – you can go with her."*** Jane looks sad. ***"How? I've got six other children. I can't just leave them."***

بۆب دەستی دەخاتە سەر شانی ژنەکە :"بەڵێ، بەڵام ئەوە باشە تۆ دەتوانیت لەگەڵیدا بڕۆیت." جەین خەمبار دیارە :"چۆن؟ من شەش منداڵی ترم هەیە، بەڕاستی ناتوانم بەجێیان بهێڵم."

Suddenly Joanna has an idea. ***"Wait a minute,"*** she says. ***"Why don't I go to Sydney with Mary? After all, I'm on holiday for two weeks after today."*** ***"Good idea,"*** says the Flying Doctor. They look at Jane. ***"OK,"*** she says.

لەپڕ جۆنا بیرۆکەیەکی بۆ دێت، دەڵێ :"تاوێ ڕاوەستە! بۆ من لەگەڵ ماری نەچم بۆ سیدنی؟ سەرەڕای ئەوەیش(خۆ) من دوای ئەمڕۆ بۆ دوو هەفتە لە پشودام." پزیشکە گەڕۆکەکە دەڵێ :"بیرۆکەیەکی باشە." ئەوان تەماشای جەین دەکەن، جەین دەڵێ :"باشە."



Twenty – four hours later, Joanna arrives in Sydney for the first time. Two nurses are waiting at the airport. They drive her and Mary very fast to a big hospital. Then they take Mary into Room 308.

بیست و چوار کاتژمێر دواتر جۆنا بۆ یەکەم جار دەگاتە سیدنی. دوو پەرستار لە فڕۆکەخانەکە چاوەڕوانن، زۆر بەخێرایی ئەو و ماری بە ئۆتۆمبیل دەگەیەننە نەخۆشخانەیەکی گەورە. پاشان ماری دەبەن بۆ ژووری 308.

A doctor is waiting there. ***"Hello,"*** he says. ***"My name's Paul Griffin."*** Joanna smiles at him. ***"Hello."*** Then she asks the nurses, ***"Can I help?"***

پزیشکێك چاوەڕوانە لەوێ، دەڵێ :"مەرحەبا، ناوم پاوڵ گریفنە." جۆنا خەندەیەکی بۆ دەکات :"مەرحەبا" پاشان جۆنا لە پەرستارەکان دەپرسێت :"من دەتوانم یارمەتیتان بدەم؟"



Joanna spends all day at the hospital. But after eight hours she is very tired. Paul Griffin sees this. ***"Why don't you stay with me and my wife tonight?"*** he asks. ***"Thanks,"*** says Joanna. ***"That's really nice of you."***

**جۆنا هەموو ڕۆژەکە لە نەخۆشخانە بەسەر دەبات. بەڵام دوای هەشت کاتژمێر زۆر ماندووە. پاوڵ گریفن ئەمە دەبینێت (تێبینی ئەمە دەکات)، دەپرسێت :"بۆ ئەمشەو لەگەڵ من و هاوسەرەکەم نامێنیتەوە؟" جۆناس دەڵێ :"سوپاس، بەڕاستی ئەوە چاکەیە لەلایەن تۆوە."**

At six o'clock she and Paul drive to his house. There, Joanna meets Paul's wife, Fran. She meets their daughter, too. Her name is Polly.

**لە کاتژمێر شەشی تەواودا ئەو و پاوڵ لێدەخوڕن بۆ ماڵی پاوڵ. لەوێ جۆنا چاوی بە (فران)ی هاوسەری پاوڵ دەکەوێت، هەروەها چاوی بە کچەکەیشیان دەکەوێت، ناوی (پۆڵی)یە.**



After dinner, Paul shows Joanna to her room. Joanna sits on the bed. ***"Is Mary going to be OK?"*** she asks. ***"I don't know,"*** Paul replies. Then he says, ***"But we're going to do everything we can."***

دوای نانی ئێواره، پاوڵ ڕێنمویی جۆنا دەکات بۆ ژوورەکەی. جۆنا لەسەر جێگای نوستنەکە دادەنیشێت، دەپرسێت :"ئایا ماری باش دەبێت؟" پاوڵ وەڵام دەداتەوە :"نازانم، بەڵام ئێمە هەموو شتێك دەکەین کە لە توانامانداا بێت."

After that, Joanna goes to the hospital every day. She helps the nurses and sits beside Mary's bed. For three days nothing happens.

دوای ئەوە جۆنا هەموو ڕۆژێك دەچێت بۆ نەخۆشخانە. یارمەتی پەرستارەکان دەدات و لەتەنیشت جێگاکەی ماری دادەنیشێت. بۆماوەی سێ ڕۆژ هیچ شتێك ڕوونادات.



Then one afternoon, Joanna is reading a book in Room 308. Suddenly she hears a noise. ***"What's that?"*** she thinks. Then she hears it again: ***"Mama!"***

پاشان، دوای نیوەڕۆیەك جۆنا لە ژووری 308 پەرتوكێك دەخوێنێتەوە. لەپڕ گوێی لە شتێك دەبێت. بیردەكاتەوە "ئەوە چىیە؟" پاشان جارێكی تر گوێی لێ دەبێتەوە :"دایە!"

She stands up and walks to Mary's bed. ***"Mary, it's you! You're sitting up. You're talking."***
She runs out of the room and finds Paul. ***"Quick, Doctor Griffin,"*** she says. ***"It's Mary. Come and see."***

جۆنا هەڵدەستێتە سەرپێ و بەرەو جێگاكەی ماری دەڕوات، :"ماری ئەوە تۆی! تۆ دادەنیشیت، تۆ قسە دەكەیت." لە ژوورەكە ڕادەكاتە دەرەوە و پاوڵ دەدۆزێتەوە، دەڵێ :"خێراكە دكتۆر گریفن، ئەوە ماریىیە، وەرە و بیبینە."



Later that day Joanna telephones Bob Mills. ***"Yes – that's right. Mary's going to be OK,"*** she says with a big smile. ***"I can bring her home next week."***

درەنگانێکی ئەو ڕۆژە، جۆنا تێلەفون بۆ بۆب میلس دەکات. بە خەندەیەکی گەورەوە دەڵێ :"بەڵێ ئەوە ڕاستە، ماری بەرەو باش بوون دەچێت، دەتوانم هەفتەی داهاتوو بیهێنمەوە بۆ ماڵ."

That evening the Griffins take Joanna to an expensive restaurant. Joanna sits next to the window. Outside, she can see the lights of Sydney. ***"This is beautiful,"*** she says.

ئەو ئێوارەیە گریفنەکان (پاوڵ و خێزانەکەی) جۆنا دەبەن بۆ ڕێستۆرانتێکی گرانبەها. جۆنا لەتەنیشت پەنجەرەکەوە دادەنیشێت. دەتوانێت گلۆپەکانی (ڕووناکیەکانی) سیدنی ببینێت لە دەرەوە، دەڵێ :"ئەمە جوانە."



Next morning at breakfast Paul says, ***"Joanna, you can stay here at home today. After all, Mary's Ok now."***
***"No, thanks,"*** says Joanna, ***"... I want to be with her."***

بەیانی داهاتوو لە نانی بەیانیدا، پاوڵ دەڵێ :"جۆنا تۆ دەتوانیت ئەمڕۆ لێرە لە ماڵەوە بمێنیتەوە، خۆ ماری ئێستا باشە." جۆنا دەڵێ :"نا، سوپاس. دەمەوێت لەگەڵ ئەو بم."

At the hospital, Paul sees Sister Clark. ***"One of my girls is leaving next week and we need someone new,"*** she says. ***"What about Joanna Jimbuku? She's a very good nurse. Do you think she wants a job her?"***

لە نەخۆشخانەکە، پاوڵ سستەر کلارك دەبینێت، دەڵێ :"یەکێك لە یاریدەدەرە کچەکانم هەفتەی داهاتوو بەجێمان دەهێڵێت وە ئێمە پێویستمان بە کەسێکی تازەیە."ڕات چیە دەربارەی جۆنا جیمبوکیو؟ ئەو پەرستارێکی زۆر باشە. ئایا پێت وایە ئەو لێرە کارێکی بوێت؟"



*"Me?!"* says Joanna that evening. She looks at Paul. *"Why not?"* he says. *"After all, Sister Clark's right ... you're a very good nurse."*
Joanna is quiet.

ئەو ئێوارەیە جۆنا دەڵێ :"من؟!" تەماشای پاوڵ دەکات. پاوڵ دەڵێ :"بۆ نا؟ خۆ سستەر کلارك ڕاست دەکات ... تۆ پەرستارێکی زۆر باشیت."
جۆنا بێدەنگە.

*"Don't say anything now,"* Paul tells her. *"Just think about it. That's all I'm asking."* He walks away, then turns. *"But not for too long, OK?"*

پاوڵ پێی دەڵێ :"ئێستا هیچ شتێك مەڵێ، تەنها بیری لێ بکەرەوە. ئەوە هەموو ئەوەیە کە داوای دەکەم." پاوڵ دەڕوات، پاشان لادەکاتەوە :"بەڵام بۆ ماوەیەکی دورودرێژ نا، باشە؟"



The next day is Saturday. Joanna goes to the hospital and sees Mary. ***"Hello, little one,"*** she says. ***"You're going home on Monday."*** Then she thinks, ***"Or are we going home?"***

**ڕۆژی داهاتوو شەممەیە. جۆنا دەچێت بۆ نەخۆشخانەکە و ماری دەبینێت، دەڵێ :"مەرحەبا بچکۆل، تۆ ڕۆژی دوو شەممە دەچیتەوە ماڵ." پاشان بیردەکاتەوە "یان ئایا دەچینەوە ماڵ؟"**

Two hours later, Fran and Polly meet Joanna for lunch. ***"Oh Joanna, you are going to stay in Sydney, aren't you?"*** says Polly. ***"I don't know,"*** says Joanna.

**دوو کاتژمێر دواتر، فران و پۆلی چاویان بە جۆنا دەکەوێت بۆ نانی نیوەڕۆ. پۆلی دەڵێ :"ئای جۆنا تۆ لە سیدنی دەمێنیتەوە، وا نییە؟" جۆنا دەڵێ :"نازانم."**



Later in the afternoon Joanna goes for a long walk. The weather is hot. She watches the people in the streets. She looks at all the shops, cinemas, museums and theatres, too.

درەنگانێکی پاش نیوەڕۆ جۆنا دەچێت بۆ پیاسەیەکی دورودرێژ. ئاووهەوا گەرمە. ئەو تەماشای خەڵکی ئەکات لە شەقامەکاندا، هەروەها تەماشای هەموو فرۆشگاکان، سینەماکان، مۆزەخانەکان و شانۆگەکانیش دەکات.

***"Sydney's great,"*** she thinks. ***"It's very beautiful, and there's a lot to see and do. But do I really want to live here – that's the question."***

بیردەکاتەوە "سیدنی گەورەیە، زۆر جوانە، وە زۆرشت هەیە بۆ بینین و کردن. بەڵام ئایا بەڕاستی من دەمەوێت لێرە بژیم– ئەوە پرسیارەکەیە."



Across the street there is a shop window. Joanna turns and looks in it. She can see a big painting of some red hills. ***"Wait a minute,"*** she thinks. ***"I know that place. It's near Woomara."***

ئەوبەر شەقامەکە جامخانەی دوکانێکە. جۆنا لادەکاتەوە و سەیری ناوەوەی دەکات. دەتوانێت تابلۆیەکی گەورەی هەندێك گردی سوور ببینێت، بیردەکاتەوە "ساتێك چاوەڕێبە، من ئەو جێگایە دەناسم، نزیکی هوومارایە."

Ten minutes later a man comes out of the shop. ***"Are you Ok?"*** he asks. Joanna smiles. Her eyes are wet. ***"Yea,"*** she says. ***"I'm fine. Really – I'm fine."***

دە خولەك دواتر پیاوێك لە دوکانەکە دێتە دەرەوە، دەپرسێت :"ئایا تۆ باشیت؟" جۆنا بزە دەیگرێت، چاوەکانی تەڕن، دەڵێ :"بەڵێ، من باشم، لەڕاستیدا– من باشم."



Two days later Bob gets into The Bluebird. Joanna is with him. She waves goodbye to Jane and Mary. Bob starts the plane and pushes his hat back. ***"Listen – thanks for everything, Joanna,"*** he says. ***"In Sydney, I mean. It's a beautiful city, isn't it?"***

**دوو ڕۆژ دواتر بۆب دەچێتەوە بۆ بلوبێرد. جۆنای لەگەڵدایە، خواحافیزی لە جەین و ماری دەکات. بۆب فڕۆکەکە دەخاتە ئیش و پاڵ بە کڵاوەکەیەوە دەنێت بۆ دواوە، دەڵێ :"گوێبگرە جۆنا، سوپاس بۆ هەموو شتێك، مەبەستم لە سیدنیيە. شارێکی جوانە، وانیە؟"**

Joanna looks at the red hills of Woomara. Then she smiles, too. ***"Yes,"*** she says. ***"But it's good to be home."***

**جۆنا تەماشای گردە سوورەکانی هوومارا دەکات. پاشان بزەیش دەیگرێت، دەڵێ :"بەڵێ، بەڵام باشترە لە نیشتمانی خۆت بیت."**

پرۆژەی خوێراهێنان لەسەر زمانی ئینگلیزی
زنجیرەیەك چیرۆكە بۆ بەهێزكردنی زمانی
ئینگلیزی، كە بە شەش ئاستی جیاواز
دەردەچێت ، وە لە هەر ئاستێكدا
ژمارەیەك ووشەی نوێ فێردەبیت

ئاستی یەكەم : دەسپێكەران
ئاستی دووەم : سەرەتایی
ئاستی سێیەم : پێش ناوەندی
ئاستی چوارەم : ناوەندی
ئاستی پێنجەم : دواناوەندی
ئاستی شەشەم : پێشكەوتوان

Level - 1 -